زنجیرەی گەنجانی  ئیسلام (2)

## کامیان باشترە

# شەهیدی یان سەرکەوتن

ئامادەکردنی

مامۆستا خوبەیبی ڕزگاری



بسم اللَّه الرحمن الرحيم

الحمد لله الذي أمر بالجهاد في سبيله، ووعد عليه الأجر العظيم والنصر المبين، وأشهد أن لا إله إلا اللَّه وحده لا شريك له القائل في كتابه الكريم: (وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ الْمُؤْمِنِينَ [الروم:٤٧] وأشهد أن محمدا عبده ورسوله وخليله أفضل المجاهدين وأصدق المناضلين وأنصح العباد أجمعين ﷺ وعلى آله الطيبين الطاهرين، وعلى أصحابه الكرام الذين باعوا أنفسهم للَّه وجاهدوا في سبيله حتى أظهر اللَّه بهم الدين وأعز بهم المؤمنين، وأذل بهم الكافرين رضي اللَّه عنهم وأكرم مثواهم وجعلنا من أتباعهم بإحسان إلى يوم الدين.

ڕۆژێکیان " ئەنصاریی و موهاجیر " دانیشتن بۆ فێربوون لە کتێبی خوای گەورە (قورئانی پیرۆز) لەسەر ئەو ئایەتانەی باسی جیهاد دەکەن، دانیشتبوون هانی یەکتریان دەدا بۆ جیهاد کردن لە پێناوی خوا.

ئەم ئایەتەیان دەخوێندەوە (قُلۡ هَلۡ تَرَبَّصُونَ بِنَآ إِلَّآ إِحۡدَى ٱلۡحُسۡنَيَيۡنِۖ وَنَحۡنُ نَتَرَبَّصُ بِكُمۡ أَن يُصِيبَكُمُ ٱللَّهُ بِعَذَابٖ مِّنۡ عِندِهِۦٓ أَوۡ بِأَيۡدِينَاۖ فَتَرَبَّصُوٓاْ إِنَّا مَعَكُم مُّتَرَبِّصُونَ) سُورَةُ التَّوبَة "٥٢".

موهاجر لەسەر (إِحدَى ٱلحُسنَيَينِ) ڕاوەستا.
ئەنصاری ووتی: واتە یان شەهیدی یان سەرکەوتن.
موهاجر پرسیاری لێ کرد: یا شەهیدی یا سەرکەوتن؟
ئەنصاری وەڵامی دایەوەو ووتی: بەڵێ یا شەهیدی یا سەرکەوتن.
موهاجر لێی پرسی: کامیان باشترە بۆ کەسی موجاهید شەهیدی یا سەرکەوتن ؟
ئەنصاری پێی فەرموو: براکەم ئایا گوێت لە ئایەتی خوای گەورە نەبووە دەفەرموویێت: (ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّـٰهُم فِى ٱلأَرضِ أَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُواْ بِٱلمَعرُوفِ وَنَهَواْ عَنِ ٱلمُنكَرِ وَلِلَّهِ عَـٰقِبَةُ ٱلأُمُورِ) سُورَةُ الحَجّ "٤١".
فەرمووی تەمکین لە سەر ئەرز لە دوای سەرکەوتن دێت دژ بە دووژمنانی دین.
موهاجر پێی دەڵێت: ئەوە ڕاستە براکەم بەڵام خوای گەورە دەفەرموویێت: (يَـٰأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ هَل أَدُلُّكُم عَلَىٰ تِجَـٰرَةٍ تُنجِيكُم مِّن عَذَابٍ أَلِيمٍ (١٠) تُؤمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُجَـٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَموَٰلِكُم وَأَنفُسِكُم ذَٰلِكُم خَيرٌ لَّكُم إِن كُنتُم تَعلَمُونَ (١١) يَغفِر لَكُم ذُنُوبَكُم وَيُدخِلكُم جَنَّـٰتٍ تَجرِى مِن تَحتِهَا ٱلأَنهَـٰرُ وَمَسَـٰكِنَ

طَيِّبَةً فِي جَنَّٰتِ عَدنٍ ذَٰلِكَ ٱلفَوزُ ٱلعَظِيمُ (١٢) وَأُخرَىٰ تُحِبُّونَهَا نَصرٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَتحٌ قَرِيبٌ وَبَشِّرِ ٱلمُؤمِنِينَ (١٣)سُورَةُ الصف "١٠-١٣"
بۆیە دوای ئەوەی خوای گەورە پیشانیدان ئەوەی ئەوان خۆشیان دەویست. بۆیە خوای گەورە بۆ ئیماندارانی ئامادەکردووە کە خۆی ناوی لیێ ناوە " الفوز العظیم" واتە "سەرفرازیی گەورە" وە دە فەرمووێت: (نَصْرٌ مِّنَ الله وَفَتْحٌ قَرِيبٌ).

ئەنصاری ووتی: براکەم سەرکەوتن دەبیتە مایەی ڕامالٚینی دووژمنی دین بۆ چەسپاندنی شەریعەت.

موهاجر ووتی: ئایا خودی شەهادەت بریتی نییە لە سەرکەوتنی بیروباوەڕ؟

ئەنصاری ووتی: دەی مادەم وایە با بگەڕێینەوە بۆ لای کتێبی خواو بەدووای وەڵامدا بگەڕێین.

موهاجر ووتی: واتە با بگەڕێینەوە، خوای گەورە دەفەرمویێت: (فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى الله وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِالله وَالْيَوْمِ الآخِرِ) سُورَةُ النساء "٥٩".

ئەنصاری ووتی: براکەم خوای گەورە ئادەمی دروست کرد "سەلامی خوای لێ بێت" ناردییە سەر زەوی بۆ ئاوەدان کردنەوە ی، ئادەم و نەوەکانی دە سەدە لەسەری زەوی ژییان و شوێن کەوتی دینی خوا بوون، دوای ئەوە شتەکان گۆڕان و خەڵکیش توشی کوفرهاتن، دوای خوای گەورە پێغەمبەرانی نارد، وە یەکەمیان نوح بوو "سەلامی خوای لێ بێت" خوای گەورە ئەمری پێی کرد "توحید" یەکخواپەرستییان فێر بکات، نوح "سەلامی خوای لێ بێت" مایەوەو بانگهێشتەی کردن بە چەندین ساڵ، بەڵام چەند کەسانێکی زۆر کەم باوەڕیان پێی هێنا، بەڵام کە دڵنیا بوو وەگومانی نەما خێر لە قەومەکەیدا نەماوە، داوای لە خوا کرد و دوعای لێ کردن خوا لە ناویان ببات، ئەوە بوو خوای گەورە لافاوێکی بۆ ناردن هەموو کافرەکانی نوقمی ئاو کرد، تەنها ئەوانە مانەوە کە باوەڕیان هێنا بوو.

هەموو پێغەمبەرێك وەعدی سەرکەوتنیان دەدا بە شوێن کەوتوانیان لە کاتێکدا خوای گەورە کافرەکانی تەفرو تونا دەکرد.

خوای گەورە دەفەرمووێت: (وَلَقَدْ سَبَقَتْ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا الْمُرْسَلِينَ إِنَّهُمْ لَهُمُ الْمَنْصُورُونَ)سُورَةُ الصَّافات "١٧١-١٧٢".

خوای گەوەرە سزای قەومی عادو سەموودو ئەصحابی ئەیکەو قەومی لوتتی داو، فیرعەونی تەفروتوونا کردو سەرکەوتنی دا بە موسا "سەلامی خوای لێبێت"و وە نەوەکانی ئیسرائیل و، خوای گەورە هیچ قەومێکی تری کافرانی تەفروتونا نەکرد لە دووای فیرعەون، بەڵام تەفروتووناکردنیانی لەسەر دەستی ئیمانداران بۆ ناردوون، ئەوانەی فەرمانی شەڕو جیهادیان پێکرابوو، خوای گەورەش دەفەرموویت: (قَاتِلُوهُمْ يُعَذِّبْهُمُ الله بِأَيْدِيكُمْ وَيُخْزِهِمْ وَيَنصُرْكُمْ عَلَيْهِمْ وَيَشْفِ صُدُورَ قَوْمٍ مُّؤْمِنِينَ) سُورَةُ التَّوبَة "١٤".

موهاجر ووتی: ئەمە بەو مانایە نییە کە سەرکەوتن باشترە لە شەهیدی بۆ کەسی موجاهید.

چوونکە زۆر گەورەیە بۆ مرۆڤ گرانترین شتی خۆی کە ژییانییەتی ڕابخات لەپێنای خوا، خوای گەورە دەفەرموویت: (إِنَّ الله اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُم بِأَنَّ لَهُمُ الْجَنْةَ)سُورَةُ التَّوبَة "١١١".

هەر بۆیە نابێت لەبیرمان بچێت فەرموودەی پێغەمبەری خوا "درودی خوای لەسەر بێت" کە دەفەرموویت: "هەموو قەومەکان هێنران، دەم بینین پێغەمبەر هەبوو یەك کەسی لەگەڵ بوو،

پێغەمبەریش هەبوو یەك یا دوو كەسی لەگەڵ بوو، پێغەمبەریش هەبوو هیچ كەسی لەگەڵ نەبوو".

بۆیە پێغەمبەر هەبووە لەسەر دەستی قەومەكەی دەكوژرا، ئایا دەكرێت مسوڵمان بڵێت ئەوان سەركەوتنیان بە دەست نەهێنا؟! بەڵكو سەركەوتنیان بەدەست هێنا بەوەی لە شوێنەكانی خۆیاندا مانەوەو سەباتیان كرد تێیدا، جا بۆیە كوشتنی هەموو موجاهیدان هەتا ئاخیر پیاویان لە پێناوی خوا، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت كە ئەمان سەرنەكەوتن و هەزیمەتیان هێناوە، لەبەر ئەوەی ئەوان ئەوەی لەسەریان بووە پێی هەستاون، وەڵڵاهی بە بێ دوودڵی خوا دینی خۆی سەر دەخات، وە خوێنی شەهیدەكان ژیانە بۆ ئەوانەی دوای خۆیان.

ئیمامی موسلیم و، ترمزی و غەیری ئەوانیش بەسەرهاتی ئەسحابی خەندەق دەگێڕنەوە، لەم بەسەرهاتەدا باس لە گەنجێك دەكەن كە دەرسی دەخوێند لای ساحیرێك و لای عالمێكیش، دووای شوێن ڕێبازی عالمەكە دەكەوێت و، پادشاكە دەیەوێت ئەو گەنجە بكوژێت، بەڵام پادشاكە هەرچەند تیر دەدات لەم گەنجە ناتوانێت بی كوژێت، بۆیە گەنجەكە بە پادشاكە دەڵێت ناتوانیت بم كوژی

تا له کاتی تیر هاوێشتنه‌که نه‌ڵێیت: (بسم اللَّه) به‌ناوی خوای ئه‌م گه‌نجه" که پادشاکه ئه‌م کاره‌ی کرد گه‌نجه‌که‌ی کوشت به‌ڵام ئه‌و خه‌ڵکه‌ی له‌وێ بوون و ڕووداوه‌که‌یان بینی هه‌موویان باوه‌ڕیان هێناو ووتیان:" باوه‌ڕمان هێنا به خوای گه‌نجه".

خوا کوشتنی گه‌نجه‌ی کرد به هۆی باوه‌ڕهێنانی ئه‌و خه‌ڵکه، ئایا ده‌کرێت بووترێت ئه‌و گه‌نجه سه‌رکه‌وتنی به‌ده‌ست نه‌هێنا؟!

نه‌خێر به هیچ شێوه‌یه‌ك.

ئه‌و سه‌رکه‌وت به هۆی بانگهێشته کردنی خه‌ڵکی بۆ ئه‌وه‌ی ئیمان بهێنن ئه‌وه بوو خه‌ڵکی باوه‌ڕیان هێنا!!

هه‌ر بۆیه له‌سه‌ر هه‌موو موجاهیدێکه له ناخی خۆیدا نییه‌تی شه‌هیدبوونی هه‌بێت، هه‌ر بۆیه ده‌بێت دڵ خۆش بێت بۆ شه‌هید بوون جا هه‌ر پله‌و پایه‌یه‌کی هه‌یه، ئایا سه‌رکرده‌یه یان گوێڕایه‌ڵ، ده‌بێت خۆی ئاماده بکات بۆ شه‌هیدی، چونکه سه‌رکه‌وتن به‌ده‌ست خوایه ده‌یدا به‌و که‌سه‌ی خۆی ده‌یه‌وێت له عه‌بده‌کانی.

ئه‌وجا ئه‌نصاری ووتی: ده‌ی مادام وایه حیکمه‌تی خۆ ئاماده‌کردن چییه دژ به دووژمان ئه‌گه‌ر ئێمه ته‌نها ئاواتمان مردن بێت له پێناوی خوادا؟!

موهاجر وەڵامیدایەوەو ووتی: من مەبەستم ئەوە نەبوو کە خۆ ئامادەکردن لە ترساندایە، چونکە خۆ ئامادەکردن فەڕزەو واجبە لەسەر هەموو موجاهیدێك.

خوای گەورە دەفەرموویێت: (وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدْوَّ الله وَعَدُوَّكُمْ) سُورَةُ الأنفَال "٦٠".

بەڵام لەسەر هەموو موجاهیدێکە ئەم واتایە بزانێت چۆن پێغەمبەر "سەلامی خوای لەسەر" هاوەڵانی فێردەکرد.

ئەنصاری ووتی: داواکارم هەندێك نموونەم پێ بدەیت لەوەی کە پێغەمبەر " سەلامی خوای لەسەر" فەرموویەتی بە هاوەڵانی لەم بارەیەوە.

موهاجر ووتی: وا دەکەم، پێغەمبەری خوا "سەلامی خوای لەسەر" بەڵێنی لە ئەنصارییەکانی وەردەگرت، ئەنصارییەکانیش پرسیاریان لێ کرد ئەم بەڵێنە لەسەر چییە؟

فەرمووی: (بەڵێنم پێبدەن لەسەر گوێڕایەڵی کردنم و شوێنکەوتنم، لە خۆشی و ناخۆشیدا، وە لە بەخشینی ماڵەکانتان لەکاتی ئاسان و قورستدا، وەلە ئەمر کردن بە چاکەو ڕێگرتن لە خراپە، وە لە پیناو خوادا قسە بکەن و گوێ مەدەن بە قسەو قسەڕۆکی خەڵکی، وە

سەرم بخەن کاتێك هاتمە لاتان، وە بەرگریم لێ بکەن وەك چۆن بەرگری لە خۆتان و خێزانەکانتان و منداڵەکانتان دەکەن، وە بەهەشت بۆ ئێوە).

پێغەمبەر " دروودی خوای لەسەر بێت" لەم بەڵێن وەرگرتنە لەگەڵ ئەنصارییەکاندا بەڵێ لێ وەرنەگرتن لەسەر شتێك بۆ ئەم ژییانە، بە ڵکو بەڵێنی بەهەشتی پێدان، وە بەهەشتیش نایەت تا دووای مردن، ئایا دەتەوێت بە مردنێك بمریت مردنێکی ئاسایی بێت یان دەتەوێت بە شەهیدی بمریت !؟

دووەم: خوای گەورە بەڵێنی دا بە پێغەمبەر "درودی خوای لەسەر بێت" کە سەر دەکەوێت لە شەڕی بەدر بە یەکێك لەم دووانە یا " دەست گرتن بەسەر کاروانەکە" یان "سەرکەوتن بەسەر جێشەکەدا"

خوای گەورە دەفەرمووێت: (وَإِذْ يَعِدُكُمُ اللَّه إِحْدَى الطَّائِفَتين أَنَّهَا لَكُمْ) سُورَةُ الأنفَال "٧".

کاتێك پێغەمبەر "سەلامی خوای لەسەر بێت" فریشتەکانی بینی پێش شەڕ فەرمووی بە هاوەڵانی: هەستن بۆ بەهەشتێك کە پانتاییەکەی ئەرزو ئاسمانە.

دەبینی نەی فەرموو: "هەستن بۆ سەرکەوتن" لە کاتێکدا خوای گەورە بەڵێنی سەرکەوتنیشی پێدابوو.

بۆیە فەرزە لەسەر موجاهیدان خۆیان ڕابهێنن لەسەر خۆشەویستی بۆ شەهیدبوون و، وە بۆ بەهەشت و، ڕازی بوونی خوای گەورە.

وە دەبێت بزانێت سەرکەوتن لای خواوەیە دەیدات بەوەی خۆی وویستی لەسەر بێت، ئەوانیش هاوەڵانی پێغەمبەر بوون کە لەسەر ئەم مانایە خۆیان ڕاهێنابوو.

کاتێك ئەبو بەکری سدیق "ڕەزای خوای لێبێت" جێشی بەڕێ دەکرد دەی فەرموو: دا خوازی مردن بکەن، دەبەخشرێت پێتان ژییان".

خالیدی کوڕی وەلید پەیامی دەنارد بە پەیامنێرەکاندا بۆ سەرکردە ی فارس، تەهدیدیانی دەکردو و پێیانی دەفەرموو: لە خالیدی کوڕی وەلیدەوە بۆ سەرکردەی فارس. سەلامی خوا لەسەر ئەوانە ی شوێن هیدایەت دەکەون، من سوپاس گوزاری ئەو خوایە

دەکەم کە هیچ هاوەڵ و هاوتایەکی نییە، دوای سوپاسی بۆ ئەو خوایەی پەروەردگار کە پارچە پارەچەو پەرتەوازەی کردن و دەسە ڵاتانیشی لاواز کردن وە موڵکو ماڵ و سامانەکانتانی لێ سەندنەوە، کاتێك ئەم نامەتان پێ دەگات باج و جزییەکانتان بنێرن، لە بەرامبەری ئەوەدا خوێن و ماڵتان پارێزراو دەبێت، وە ئەگەر بێت و ئەمە نەکەن سوێند بەو خوایەی هاوەڵی نییە جێشێکتان بۆ دەنێرم کە ئێوە چەندە ژییانتان لا خۆشەویستە ئەوان هێندە مردنیان خۆش دەوێت!!

ئا بەم شێوە هاوەڵانی پێغەمبەر " سەلامی خوای لەسەر" مردنیان خۆش دەویست بۆیە خوای گەورەش سەرکەوتنی پێ دەبەخشین لەم دونیایە، هەر بۆیە، خۆشەویستی شەهیدی لە پێناوی خوادا، ئەگەر چی دەست کەوتێکی گەورەشی تێدا بێت، ئەو دەست کەوتەش سەرکەوتنە لەم دونیایە، لەبەر ئەوەی کەس ناتوانێت بەر هەڵستی کەسانێك ببێتەوە کە مردنیان لا خۆشەویست تر بێت وەك چۆن خەڵکانێك ژییانیان لا خۆشەویستە ترە؟

ئەنصاری فەرمووی: وەڵڵاهی نەمدەزانی فەرقێکی زۆر هەیە لە بە ینی ئەو دوو سەرکەوتنەدا کە ناویان هات "سەرکەوتنی شەهید و، سەرکەوتنی سەرکەوتن" لەو ئایەتانەی باس کران، من وام دەزانی "شەهیدی گەورە ترو باشترە لە سەرکەوتن" بەڵام لە ڕاستیدا هەردوك هەر سەرکەوتنە.

موهاجر ووتی: پێشڕەومان محمد "سەلامی خوای لەسەر بێت" خۆی تەمەننای شەهیدی کردووەو، خۆ ئەو باشترین مرۆڤە، دەفەرمووێت: " بەناو ئەو تاك و تەنهایەی "اللّٰه" ڕۆحی منی بەدەستە، تەمەننام ئەوەیە شەڕ بکەم لە پێناو خواداو بکوژرێم، شەڕ بکەم و بکوژرێم، دوای هەم شەڕبکەم و بکوژرێم: (والذی نفس محمد بیده لوددت أنی أغزو فی سبیل اللّٰه فأقتل، ثم أغزو فأقتل، ثم أغزو فأقتل) مسلم.

لە ڕیوایەتێکی تر دەفەرمووێت:

(والذى نفسى بيده لوددت أنى أقاتل فى سبيل اللَّه فأقتل، ثم أحيا ثم أقتل، ثم أحيا ثم أقتل، ثم أحيا ثم أقتل ثم أحيا)مسلم والبخارى

مادام وایە کام لە ئێمە شتێکی وا گەورەی ناوێت لە کاتێکدا باشترین مرۆڤ تەمەنناى کردبێت بۆ خۆی لە کاتێکدا دڵنیاش بووە ئەو لە بەرزترین پلەیە لە بەهەشت "الفردوس الأعلى"؟!\

خوایە شەهیدیمان بە قسمەت بکەو لە خوێن و ماڵ و کاتەکانمان ببە هەتا لێمان ڕازی دەبیت..

ئەنصاری ووتی: "ئامیین"